

# فەزڵ و تایبەتمەندی
# مانگی موحەڕەم و ڕۆژی عاشورا



ئامادەکرنی
عثمان احمد حاتم



# فەزڵ و تایبەتمەندی

# مانگی موحەڕەم و ڕۆژی عاشورا

ئامادەکردنی

عوسمان ئەحمەد حاتەم

موحەڕەم ـ ١٤٤٥هـ

## پێشەکی

الحمد لله، والصلاة والسلام على رسول الله وعلى آله وصحبه وسلم تسليماً كثيراً، وبعد:

کات لە سامان و ماڵ زۆر گرنگترە، چونکە کاتێك ئەگەر تێپەڕی ناتوانرێت بە هیچ شێوەیەك بگەڕێنرێتەوە، بەڵام سامان و ماڵ ئەگەر لە دەست بچن دەشێت بە دەست بهێنرێنەوە، یەکێك لەوشتانەی لە قیامەتدا مرۆڤ هەنگاو هەڵناگرێت هەتاکو پرسیاری لەبارەیەوە لێنەکرێت کاتە، ترمزی لە ئەبوبەرزەی ئەسلەمییەوە ﵁ ڕیوایەتیکردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((لا تزولُ قدَما عبدٍ يومَ القيامةِ حتّى يسألَ عن عمرِه فيما أفناهُ...)).

واتە: مرۆڤ لە قیامەتدا هەنگاو هەڵناگرێت هەتاکو پرسیاری لێنەکرێت: دەربارەی تەمەنی لەچیدا بەسەری بردووە...

ئیبن قەیم دەڵێت: بەفیڕۆدانی کات قورسترو گەورەترە لە مردن، چونکە بە فیڕۆدانی کات لە خوا و ڕۆژی قیامەت دادەبڕێت، مردن لە دونیا و خەڵکەکەی دادەبڕێت[1].

کەواتە تێپەڕبوونی شەو و ڕۆژ و مانگ و ساڵەکان لە بەڵگە و نیشانەکانی دەسەڵاتی خوان، مۆڵەتن بۆ مرۆڤەکان بۆ ئەوەی کردەوەی چاکیان تێدا ئەنجامبدەن، هەوڵبدەن ڕەزامەندی خوا بە دەست بهێنن.

لەم نامیلکەیەدا باسی سەری ساڵی کۆچی و چۆنییەتی دیاریکردنی و ڕۆژووگرتن لە مانگی موحەڕەم و ڕۆژی عاشورام کردووە، بەڵگەم لەسەر هەریەکە لەو مەبەستانە باسکردووە، بەوهیوایەی هاندەری موسڵمانان بێت بۆ ڕۆژووگرتن لە مانگی موحەڕەم و ڕۆژی تاسوعا و عاشورا.

عوسمان ئەحمەد حاتەم
گەرمیان–کەلار
١٤٤٥/١/١هـ
٢٠٢٣/٧/١٩

---

١. (الفوائد)(٣١).

## بۆچی ناوی موحەڕەمی لێنراوە و ئیزافەکراوە بۆ لای خوا

حافزی عێراقی لە (شرح الترمذي)دا دەڵێت: حیکمەت چییە مانگی موحەڕەم ناوی مانگی خوای (شهر الله) لێنراوە و مانگەکان هەمووی مانگی خوان، دەشێت لەبەر ئەوەبێت یەکێکە لەو مانگانەی شەڕ و کوشتاری تێدا حەرامکراوە، تەنها مانگی ساڵە ئیزافەکراوە بۆ لای خوا ﷻ ئەوەش بۆ تایبەتکردنی مانگەکەیە، بە صەحیحی جێگیر نەبووە هیچ مانگێك لە مانگەکان ئیزافەکرابێت بۆ لای خوا جگە لە مانگی موحەڕەم[٢].

سیوتی دەڵێت: پرسیارم لێکرا بۆچی مانگی موحەڕەم تایبەتکراوە بە (شهر الله) و مانگەکانی تر ئەو ناوەیان لێنەنراوە، لەگەڵ ئەوەی مانگی وایان تێدایە لە فەزڵدا هاوتایەتی یان فەزڵی لەو زیاترە وەك مانگی ڕەمەزان، وەڵامەکەیم بەم شێوەیە دۆزییەوە کە ئەم ناوە واتە:

---

٢. (زهر الربى على المجتبى)(٣/٢٠٧).

موحەڕەم ناوێکی ئیسلامییە جیاواز لە مانگەکانی تر، هەموو مانگەکانی تر ناوی سەردەمی نەفامییە، کە ناوی بەم شێوەیە بوو: سەفەری یەکەم، مانگەکەی دوای ئەوە سەفەری دووەم بوو، کاتێك ئیسلام هات خوا ﷻ ناوی موحەڕەمی لێنا، بەم ئیعتبارە ئیزافەکراوە بۆ لای خوا[٣].

ئەبوجەعفەری نەحاس دەڵێت: (ألف ولام) چووەتەسەر مانگی موحەڕەم و نەچووەتە سەر مانگەکانی تر، چونکە مانگە حەرامەکان چوار مانگن، ئەم مانگە تایبەتکراوە بەم ناوەوە پێویستە (ألف ولام)ی بچێتەسەر جیاواز لە مانگەکانی تر[٤].

مانگی موحەڕەم مانگی یەکی ساڵی کۆچییە، یەکێکە لە چوار مانگە حەرامەکە، خوا ﷻ دەفەرموێت: ﴿إِنَّ عِدَّةَ ٱلشُّهُورِ عِندَ ٱللَّهِ ٱثۡنَا عَشَرَ شَهۡرٗا فِي كِتَٰبِ ٱللَّهِ يَوۡمَ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ مِنۡهَآ أَرۡبَعَةٌ حُرُمٞۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلۡقَيِّمُۚ فَلَا تَظۡلِمُواْ فِيهِنَّ أَنفُسَكُمۡۚ وَقَٰتِلُواْ

---

٣. (الديباج على صحيح مسلم بن الحجاج)(٣/٢٥٣).
٤. (عمدة الكتاب)(٩٧).

ٱلْمُشْرِكِينَ كَآفَّةً كَمَا يُقَٰتِلُونَكُمْ كَآفَّةً ۚ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٣٦﴾ (التَّوْبَة).

واتە: بێگومان ژمارەی مانگەکان لای خوا دوازدە مانگە، خوا ئەوەی لە حوکمی خۆیدا جێگیر کردووە لەو ڕۆژەی ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە، چوار مانگیان شەڕ تیایاندا حەرامە، ئەوە ئاینی ڕاست و دروستە، لەو مانگانەدا ستەم لە نەفسی خۆتان مەکەن، شەڕ لەگەڵ هەموو هاوبەش بڕیاردەراندا بەرپا بکەن وەك چۆن ئەوان شەڕ لەگەڵ هەمووتاندا بەرپا دەکەن، بزانن و دڵنیابن کە خوا لەگەڵ پارێزکارە لە خوا ترسەکاندایە.

ژمارەی مانگەکانی ساڵ دوازدە مانگە، بەغەوی دەڵێت: مەبەست ئەو مانگانەیە کە بە دەرکەوتن و دیارنەمانی مانگ ژمارە دەکرێن، مەبەست ئەو مانگانەیە کە موسڵمانان ڕۆژوو و حەج و هەموو کردارەکانی تریانی پێ ئەنجام دەدەن، ئەو مانگانەی کە بە خۆر ئەژمار دەکرێن ژمارەی ڕۆژەکانی ساڵی سێ سەد و شەست و پێنج ڕۆژ و چارەکە ڕۆژێکە، ئەو

مانگانەی کە بە دەرکەوتنی مانگ دەژمێردرێن لە سێ سەد و شەست ڕۆژ کەمترن، و زۆر جار سێ سەد و پەنجا و چوار ڕۆژە.

بوخاری و مسلم لە ئەبوبەکرەی نەفیعی کوڕی حارسەوە ڕیوایەتیانکردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ لە حەجیماڵئاواییدا لە ڕۆژی جەژنی قورباندا فەرمووی: ((إنّ الزَّمانَ قَدِ اسْتَدارَ كَهَيْئَتِهِ يَومَ خَلَقَ اللهُ السَّمَواتِ والأرْضَ، السَّنَةُ اثْنا عَشَرَ شَهْرًا، مِنها أرْبَعَةٌ حُرُمٌ، ثَلاثٌ مُتَوالِياتٌ: ذُو القَعْدَةِ، وذُو الحِجَّةِ، والمُحَرَّمُ، ورَجَبُ، مُضَرَ الذي بيْنَ جُمادَى، وشَعْبانَ)).

واتە: ئێستا کات وەك ئەو سەردەمەی لێهاتووە کە خوا ئاسمانەکان و زەوی دروستکردووە، ساڵێك دوازدە مانگە، چواریان مانگی حەرامن، سیانیان بە دوای یەکدا دێن کە بریتیین لە: (ذُو القَعْدَةِ، ذُو الحِجَّةِ، المُحَرَّمُ)، مانگی ڕەجەبی هۆزی (مضر) کە لە نێوان جومادی کۆتایی و شەعباندایە.

ئیبن کەسیر لە سەخاوییەوە مانای مانگەکانی گێڕاوەتەوە دەڵێت: المحرم: لەبەر جەختکردنەوە لە حەرامی ئەو ناوەی لێنراوە...، پاشان ئیبن کەسیر

دەڵێت: ﴿فَلَا تَظۡلِمُواْ فِيهِنَّ أَنفُسَكُمۡۚ﴾ واتە: لەو مانگە حەرامانەدا ستەم لە نەفسی خۆتان مەکەن، چونکە تاوانی خراپتر و زیاترە لە مانگەکانی تر، وەك چۆن تاوان لە مەککە سزاکەی دوو هێندەیە، چونکە خوا دەفەرمویێت: ﴿وَمَن يُرِدۡ فِيهِ بِإِلۡحَادِۢ بِظُلۡمٖ نُّذِقۡهُ مِنۡ عَذَابٍ أَلِيمٖ ٢٥﴾(الحَجّ)، بەوشێوەیەش تاوان لە مانگە حەرامەکاندا گەورەترە و سزای زیاترە، عەلی کوڕی تەلحە لە ئیبن عەباسەوە رضي الله عنهما ڕیوایەتیکردووە دەڵێت: ﴿إِنَّ عِدَّةَ ٱلشُّهُورِ عِندَ ٱللَّهِ ٱثۡنَا عَشَرَ شَهۡرٗا﴾ هەتا ﴿فَلَا تَظۡلِمُواْ فِيهِنَّ أَنفُسَكُمۡۚ﴾ مەبەست هەموو مانگەکانە، پاشان چوار مانگی تایبەتکردووە و حەرامی کردوون، پلە و ڕێزیانی گەورە کردووە، تاوانی لەو مانگانەدا گەورەتر کردووە، کردەوەی باش و پاداشتیش لەو مانگانەدا گەورەترە، محمدی کوڕی ئیسحاق دەڵێت: ﴿فَلَا تَظۡلِمُواْ فِيهِنَّ أَنفُسَكُمۡۚ﴾ واتە: حەرامەکانی حەڵاڵ مەکەن و حەڵاڵەکانی حەرام مەکەن وەك هاوبەش بڕیاردەران لەو مانگانەدا.

## مانگی موحەڕەم سەری ساڵە

زانایان و مێژوونووسان ناکۆکن چۆن و بۆچی ساڵژمێری کۆچی لە مانگی موحەڕەمەوە دەستی پێکردووە، ئیبن ئەسیر دەڵێت: هۆکاری ئەوەی مانگی موحەڕەم بە سەری ساڵ دیاریکراوە ئەوەبوو ئەبوموسای ئەشعەری ﷺ نامەی بۆ عومەر ﷺ نووسی: نوسراومان لە تۆوە بۆ دێت مێژووی لەسەر نییە، عومەر بۆ ئەو مەبەستە خەڵکی کۆکردەوە و پرسوڕای پێکردن، هەندێکیان گوتیان: کاتی بوونە پێغەمبەری محمد ﷺ بکە بە سەرەتای ئەو مێژووە، هەندێك گوتیان: کاتی کۆچکردنی بکە بە سەرەتای ئەو مێژووە، عومەر گوتی: کۆچکردنی دەکەین بە سەرەتای ئەو مێژووە، چونکە کۆچکردنی جیاوازی دروستکرد لە نێوان حەق و باتڵدا، ئەمە قسەی شەعبییە.

مەیمونی کوڕی مەهران دەڵێت: قەباڵەیەکیان (صك) هێنا بۆ لای عومەر لەسەری نوسرابوو مانگی شەعبان، عومەر گوتی: کام شەعبان ئەو شەعبانەی کە دێت یان ئەو شەعبانەی ئێستا تێیداین؟ پاشان بە

هاوەڵانی پێغەمبەری خوای ﷺ گوت: شتێك بۆ خەڵك دابنێن مێژووی پێ بزانن، هەندێك گوتیان: مێژووی ڕۆمەکان بەکاربهێنن، چونکە ئەوان لە سەردەمی زوالقرنەینەوە ئەو مێژووە بە کاردەهێنن، گوتی: ئەمە درێژە، گوتیان: مێژووی فارسەکان بنووسن، گوترا: هەرکاتێك پادشایەك دەسەڵات بگرێتە دەست مێژووی پێش خۆی دەسڕێتەوە، ڕەئییان هاتە سەرئەوەی ماوەی چەند ساڵە پێغەمبەری خوا ﷺ کۆچی کردووە بۆ مەدینە، ... لە کۆچی پێغەمبەری خواوە ﷺ سەرەتای ئەو مێژووەیان دیاریکرد.

محمدی کوڕی سیرین دەڵێت: کەسێك بە عومەری گوت: مێژوو دابنێن، گوتی: مێژوودانان چییە؟ گوتی: شتێکە عەجەمەکان دایانناوە مانگی فلان و ساڵی فلانی پێ دیاری دەکرێت، عومەر گوتی: شتێکی باشە، مێژوو دانێن، ڕێککەوتن کۆچی پێغەمبەری خوا ﷺ بکەنە سەرەتای ئەو مێژووە، پاشان گوتیان: کام مانگ بکەینە سەری ساڵ ؟ گوتیان: مانگی ڕەمەزان، پاشان گوتیان: موحەڕەم بکەنە سەرەتا، ئەو

کاتە خەڵك حەج بەجێ دەهێنن و دەگەڕێنەوە و مانگی حەرامە، ڕێککەوتن مانگی موحەڕەم بکەنە سەرەتای ساڵی کۆچی.

سەعیدی کوڕی موسەیەب دەڵێت: عومەر خەڵکی کۆکردەوە گوتی: کام ڕۆژ بکەینە سەرەتای مێژوو، عەلی گوتی: لە کۆچی پێغەمبەری خواوە ﷺ لەو کاتەی سەرزەمینی هاوبەش بڕیاردەرانی بەجێ هێشت، عومەر بەوشێوەیەی کرد(٥).

ئیبن حەجەر دەڵێت: چوار بۆچوون هەبوو لەسەر دیاریکردنی سەرەتای مێژووەکە، ڕۆژی لە دایکبوونی پێغەمبەری خوا ﷺ، کاتی هەڵبژاردنی بە پێغەمبەر، کۆچکردنی بۆ مەدینە، وەفاتی، ئەوەی ئەرجەح بوو لایان کۆچکردنی بوو، چونکە ساڵی دیاریکردنی لە دایکبوون و کاتی هەڵبژاردنی بە پێغەمبەر کێشەیان لەسەرە، کاتی مردنیشیان هەڵنەبژارد لەبەر ئەوەی بیرهێنانەوەی هۆکاری خەم و پەژارەیە، ئەوەی مایەوە تەنها کۆچ بوو، لە مانگی ڕەبیعی یەکەمەوە

٥. بڕوانە: (الكامل في التاريخ)(١/١٢-١٣).

دوایانخست بۆ مانگی موحەڕەم، چونکە سەرەتای ویستی کۆچکردن لە موحەڕەمدا بوو، بەیعەت لە مانگی زوالحجەدا بوو کە سەرەتای کۆچ بوو، یەکەم مانگ کە هەڵهات دوای بەیعەت و ویستی کۆچکردن مانگی موحەڕەم بوو، بۆیە گونجاو بوو بکرێتە سەرەتای ساڵ، ئەمە بەهێزترین هۆکارە بینیبێتم لە دیاریکردنی سەرەتای ساڵ ، بۆ هۆکاری دانانی مێژووش لە لایەن عومەرەوە ﵁ کۆمەڵە شتێك باسکراوە، لەوانە: ئەبونوعەیم فەزڵی کوڕی دوکەین لە تاریخەکەیدا و حاکم لە ڕێگەی شەعبییەوە ڕیوایەتیانکردووە دەڵێن: ئەبوموسا نوسراوێکی بۆ عومەر نوسی، نوسراومان لە تۆوە بۆ دێت مێژووی لەسەر نییە، عومەر خەڵکی کۆکردەوە، هەندێکیان گوتیان: سەرەتای مێژوو لە کاتی هەڵبژاردنی پێغەمبەری خوا ﷺ بە پێغەمبەرەوە بنووسە، هەندێکیان گوتیان: لە کۆچی پێغەمبەری خوا ﷺ مێژوو بنووسە، عومەر گوتی: لە کۆچەوە دەینوسین چونکە جیاوازی کرد لە نێوان حەق و باتڵدا، کۆچیان دیاریکرد ئەوە لە ساڵی حەڤدەی کۆچیدا بوو، دوای ئەوەی ڕێککەوتن هەندێکیان گوتیان: مانگی

ڕەمەزان بکەنە سەرەتای ئەو مێژووە، عوسمان گوتی: مانگی موحەڕەم بکەنە سەرەتای ئەو مێژووە، سەرەتای ساڵە و موسڵمانان فەریزەی حەج بەجێدەهێنن و دەگەڕێنەوە، ئەو قسە و باسانە لە ساڵی حەڤدەی کۆچیدابوو، عومەر گوتی: مانگی موحەڕەم بکەنە سەرەتا، ئەو کاتەی خەڵك لە حەج دەگەڕێنەوە، لەسەر ئەوە ڕێککەوتن...، پاشان دەڵێت: لە کۆی ئەم ئەسەرانە سودی ئەوە وەردەگرین ئەوەی مانگی موحەڕەمی بۆ سەرەتای مێژووەکە دیاریکرد عومەر و عوسمان و عەلی بوون[٦].

---

٦. بڕوانە: (فتح الباري)(٧/٢٦٨-٢٦٩).

## دوعای خوێندنی سەری ساڵ و سەرەتای مانگ

ئەبوقاسمی بەغەوی لە عبداللەی کوڕی هیشامەوە رضي الله عنهما ڕیوایەتیکردووە و ئیبن حەجەر لە (الإصابة) بە صەحیحی داناوە دەڵێت: (كان أصحابُ النَّبِيِّ ﷺ يَتعلَّمونَ الدُّعاءَ كما يتعلَّمونَ القُرْآنَ إذا دخل الشَّهرُ أوِ السَّنةُ: اللَّهُمَّ أدْخِلْهُ علينا بالأمْنِ والإيمانِ والسَّلامَةِوالإسْلامِ وجِوارٍ منَ الشَّيطانِ ورِضْوانٍ مَنَ الرَّحمَنِ)[٧].

واتە: هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ هەوڵی فێربوونی ئەو دوعایەیان دەدا وەك چۆن هەوڵی فێربوونی قورئانیان دەدا، ئەگەر مانگ یان ساڵی تازەیان بەسەردا بهاتایە دەیانگوت: (اللَّهُمَّ أدْخِلْهُ علينا بالأمْنِ والإيمانِ والسَّلامَةِ والإسْلامِ وجِوارٍ منَ الشَّيطانِ ورِضْوانٍ مَنَ الرَّحمَنِ).

---

٧. ئەلبانی ئەم ئەسەرەی لە (الضعيفة) لە ژێر فەرموودەی ژمارە (٣٥٠٤) هێناوە، دەڵێت: وروى الطبراني في (الأوسط) عن عبد الله بن هشام قال: (كان أصحاب رسول الله ﷺ يتعلمون هذا الدعاء إذا دخلت السنة أو الشهر: اللهم أدخله علينا بالأمن والإيمان، والسلامة والإسلام، ورضوان من الرحمن، وجواز من الشيطان)؛ قال الهيثمي: (وإسناده حسن)، وعلى هامشه ما نصه: (قلت: فيه رشدين بن سعد، وهو ضعيف. ابن حجر).

ئەحمەد و ترمزی و حاکم لە تەڵحەی کوڕی عبیداللەوە ﵁ ڕیوایەتیانکردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: ((أنّ النَّبيَّ ﷺ كانَ إذا رَأى الهِلالَ، قالَ:اللَّهمَّ أهِلَّهُ علَيْنا باليُمنِ والإيمانِ، وال سلامةِ والإسلامِ، ربِّي وربُّكَ اللَّهُ)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر مانگی ببینیایە دەیفەرموو: ((اللَّهمَّ أهِلَّهُ علَيْنا باليُمنِ والإيمانِ، والسلامةِ والإسلامِ، ربِّي و ربُّكَ اللَّهُ)).

## پیرۆزبایی سەری ساڵی کۆچی

دوای ئەوەی کە سەلما لە ساڵی حەڤدەی کۆچی لە سەردەمی پێشەوا عومەردا رضي الله عنه مانگی موحەڕەم بە سەرەتای ساڵی کۆچی دیاریکراوە، کەواتە هیچ بەڵگەیەك لە ئایەت و فەرموودە نییە لەسەر ئەو پرسە و پیرۆزبایکردن لەسەر کاتی هاتنی، پرسیارکراوە لە (لیژنەی هەمیشەی فەتوا) ئایا دروستە پیرۆزبایی بکرێت لە جگە لە موسڵمانان بە بۆنەی سەری ساڵی زاینی و سەری ساڵی کۆچی و لە دایکبوونی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ؟.

لە وەڵامدا دەڵێن: دروست نییە پیرۆزبایکردن بە هۆی ئەو بۆنانەوە، چونکە پیرۆزبایکردن لەو بۆنانەدا شەرعی نییە[٨].

پرسیارکراوە لە صالح الفوزان هەندێك لە موسڵمانان پیرۆزبایی سەری ساڵی کۆچی دەکەن، ئایا ئەوە دروستە؟.

---

٨. (فتاوى اللجنة الدائمة - المجموعة الثانية)(١/٤٥٤).

لە وەڵامدا دەڵێت: ئەمە هیچ بنەمایەکی نییە، مەبەست لە مێژووی کۆچی ئەوە نییە بکرێتە بۆنە و سەری ساڵ و جەژن و پیرۆزبایی تێدا بکرێت[٩].

ئیبن باز و ئیبن عوسەیمین بۆچوونیان وایە ئەو پیرۆزبایکردنە هیچ بنەمایەکی نییە، بەڵام لە هەندێك فەتواياندا دەڵێن: تۆ دەستپێشخەرمەبە و پیرۆزبای لە کەس مەکە بەڵام ئەگەر کەسێك پیرۆزبایی لێکردیت وەڵامی بدەرەوە، پرسیارکراوە لە ئیبن عوسەیمین: ئایا دروستە پیرۆزبای بکرێت بە بۆنەی هاتنی ساڵی تازەوە؟.

لە وەڵامدا دەڵێت: پیرۆزبایکردن بە بۆنەی هاتنی ساڵی تازەوە هیچ بنەمایەکی نییە لە کرداری سەلەفی صالح، تۆ سەرەتا پیرۆزبایی مەکە، بەڵام ئەگەر کەسێك پیرۆزبایی لێکردیت، وەڵامی بدەرەوە، چونکە ئەمە بووەتە عادەت لە نێو خەڵکدا، ئەگەرچی ئێستا کەم بووەتەوە لەبەر ئەوەی خەڵك سوپاس بۆ خوا فێری زانست بوون، پێشتر لەو بۆنەیەدا نامەیان دەگۆڕییەوە[١٠].

---

٩. بڕوانە: (الإجابات المهمة في المشاكل المدلهمة)(٢٢٩).
١٠. (لقاء الباب المفتوح)(١٩/٢٠٢).

## باشترینی مانگە حەرامەکان

زانایان ناکۆکن کام لە مانگە حەرامەکان باشترینە، ئیبن ڕەجەب دەڵێت: زانایان ناکۆکن کام لە مانگە حەرامەکان باشترە ؟ حەسەن و جگە لە ئەو دەڵێن: باشترینیان مانگی موحەڕەمە، کۆمەڵێك لە زانایانی خەلەفیش ئەو بۆچوونەیان پەسەندکردووە، وەهەبی کوڕی جەریر لە قوڕەی کوڕی خالدەوە لە حەسەن و جگە لەویشەوە ڕیوایەتیکردووە دەڵێن: خوا ساڵی بە مانگی حەرام دەستپێکرد و بە مانگی حەرام کۆتایی پێهێناوە، هیچ مانگێك لە ساڵدا نییە دوای مانگی ڕەمەزان گەورەتربێت لە مانگی موحەڕەم، پێی دەگوترا: (شهرَ اللّهِ الأصمَّ) لەبەر زۆر حەرامی[11].

بەڵگەی ئەو زانایانەی ئەم بۆچوونەیان هەیە: مسلم لە ئەبوهورەیرەوە رضي الله عنه ڕیوایەتیکردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ

---

11. (لطائف المعارف)(٨٧).

دەفەرموێت: ((أَفْضَلُ الصِّيَامِ بَعْدَ رَمَضَانَ شَهْرُ اللَّهِ الْمُحَرَّمُ، وَأَفْضَلُ الصَّلَاةِ بَعْدَ الْفَرِيضَةِ صَلَاةُ اللَّيْلِ)).

واتە: باشترین ڕۆژوو دوای ڕۆژووی ڕەمەزان ڕۆژووی مانگی خوایە کە مانگی موحەڕەمە، باشترین نوێژ دوای نوێژی فەرز شەونوێژە.

نەسائی لە (السنن الكبرى) لە ئەبوزەڕی غیفارییەوە ﵁ ڕیوایەتیکردووە دەڵێت: ((أنّه سألَ رسولَ اللهِ ﷺ أيُّ الأشهُرِ أفضَلُ؟ فقال: أفضَلُ الأشهُرِ شَهرُ اللهِ الذي تَدْعونَه المُحرَّمَ)).

واتە: پرسیارم کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ کام مانگ باشترینە؟ فەرمووی: باشترین مانگ ئەو مانگەیە کە پێی دەڵێن: مانگی موحەڕەم.

ئیبن ڕەجەب دەڵێت: ئەو ڕەهاییە ((أفضَلُ الأشهُرِ)) لەم فەرموودەیە، لێکدانەوەی ئەوەی بۆ دەکرێت دوای مانگی ڕەمەزان، وەك لە ڕیوایەتی حەسەندا بە مورسەلی هاتووە، سەعیدی کوڕی جوبەیر و جگە لەویش دەڵێن: باشترین مانگە حەرامەکان مانگی زوالحجەیە، بەڵکو گوتراوە: باشترین مانگە بە ڕەهایی، هەندێك لە شافعی

مەزهەبەکان بانگەشەی ئەوەیان کردووە باشترین مانگە حەرامەکان مانگی ڕەجەبە، ئەمە بۆچوونێکی ڕەتکراوەیە[١٢].

ئەو بۆچوونەی دەڵێن مانگی زوالحجە باشترینی مانگە حەرامەکانە ئەم فەرموودەیە دەکەنە بەڵگە کە ئەحمەد و ئیبن ماجە لە ئەبوسەعیدی خودرییەوە ﷺ ڕیوایەتیانکردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((ألا إنَّ أحرمَ الأيّامِ يومُكُمْ هذا ألا وإنَّ أحرمَ الشُّهورِ شَهْرُكُمْ هذا)).

واتە: حەرامترین ڕۆژگار ئەمڕۆژەی ئێوەیە کە ڕۆژی جەژنی قوربانە، و حەرامترینی مانگەکان ئەم مانگەی ئێوەیە کە مانگی زوالحجەیە.

---

١٢. (لطائف المعارف)(٦٨).

## ڕۆژووی سوننەت لە مانگی موحەڕەم

ئەبوهورەیرە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((أَفْضَلُ الصِّيامِ بَعْدَ رَمَضانَ، شَهْرُ اللهِ المُحَرَّمُ، وأفْضَلُ الصَّلاةِ بَعْدَ الفَرِيضَةِ، صَلاةُ اللَّيْلِ))[١٣].

واتە: باشترین ڕۆژوو دوای ڕۆژووی ڕەمەزان، ڕۆژووی مانگی موحەڕەمە، باشترین نوێژ دوای نوێژی فەرز شەونوێژە.

ئەم فەرموودە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی سوننەتە لە مانگی موحەڕەمدا ڕۆژوو زۆر بگیرێت، ڕاشکاوە کە ڕۆژووگرتنی مانگی موحەڕەم باشترین ڕۆژووی سوننەتە، بەڵام چەند فەرموودەیەك هاتووە هەندێك لە زانایان کردوویانەتە بەڵگە لەسەر ئەوەی ڕۆژووی مانگی شەعبان باشترین ڕۆژووی سوننەتە لەوانە: ئەنەس ﷺ دەڵێت: ((سُئِلَ

---

١٣. أخرجه مسلم.

النَّبِيُّ ﷺ أيُّ الصَّوْمِ أفْضَلُ بَعْدَ رَمَضانَ؟ فَقالَ: شَعْبانُ لِتَعْظِيمِ رَمَضانَ))[١٤].

واتە: پرسیارکرا لە پێغەمبەری خوا ﷺ کام ڕۆژووگرتن باشترە لە دوای ڕەمەزان ؟ فەرمووی: ڕۆژووی مانگی شەعبان بۆ بە گەورەدانانی ڕەمەزان، بەڵام ئەم فەموودەیە لاوازە و کردەوەی پێناکرێت.

محمدی کوڕی ئیبراهیم دەڵێت: ((أن أسامةَ بنَ زيدٍ كانَ يَصُومُ أشْهُرَ الحُرُمَ، فقال له رسولُ اللهِ ﷺ: صُمْ شوالًا؛ فتَرَكَ أشْهُرَ الحُرُمَ، ثم لم يَزَلْ يَصُومُ شوالًا حتى ماتَ))[١٥].

واتە: ئوسامەی کوڕی زەید رضي الله عنهما مانگە حەرامەکان بە ڕۆژوو دەبوو، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: مانگی شەوال بە ڕۆژووبە، وازی هێنا لە ڕۆژووگرتنی مانگە حەرامەکان، پاشان ڕۆژووی مانگی

---

١٤. أخرجه الترمذي وضعفه ابن حجر والألباني.
١٥. أخرجه ابن ماجه وضعفه الألباني.

شەوالی دەگرت هەتاکو وەفاتی کرد؛ ئەم فەرموودەش لاوازە و کردەوەی پێ ناکرێت.

ئیبن ڕەجەبی حەنبەلی لەسەر ئەم فەرموودەیە دەڵێت: لە سەنەدەکەیدا ئیرسال هەیە، بەڵام لە ڕێگەیەکی ترەوە ڕیوایەتکراوە بەهێزی دەکات، ئەمەش دەقە سەبارەت بە فەزڵی ڕۆژووی شەوال بەسەر مانگە حەرامەکانەوە، ئەوە لەبەر ئەوەیە مانگی شەوال دوای مانگی ڕەمەزان دێت و مانگی شەعبان لە پێش ڕەمەزانەوە دێت، مانگی شەعبان باشترە لە شەوال، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ زیاتر لە مانگی شەوال ڕۆژووی تێداگرتووە، ئەگەر ڕۆژووگرتنی شەوال باشتربێت لە ڕۆژووی مانگە حەرامەکان، کەواتە ڕۆژووگرتنی شەعبان باشترە، بەوەش دەردەکەوێت باشترین ڕۆژووی سوننەت ئەو ڕۆژووەیە نزیکە لە ڕەمەزانەوە لە پێشی یان لە دوای مانگەکەوە، وەك نوێژە سوننەتە بەردەوامەکانە لە پێش و پاشی نوێژە فەرزەکان، وەك تەواوکاری

فەرزەکانە، بەوشێوەش ڕۆژوو لە پاش و پێشی ڕەمەزان باشترین ڕۆژووی سوننەتە.

ئەو فەرموودەیەی کە دەفەرموێت: ((أَفْضَلُ الصِّيامِ بَعْدَ رَمَضانَ، المُحَرَّمُ)) مەبەست ڕۆژووی سوننەتی ڕەهایە، بەڵام پێش و پاشی ڕەمەزان لە فەزڵدا وابەستەی ڕۆژووی ئەو مانگە دەبن، وەك ئەو فەرموودەیەی دەفەرموێت:((أَفْضَلُ الصَّلاةِ بَعْدَ المَكْتُوبَةِ صَلَاةُ اللَّيْلِ)) مەبەست ئەوەیە شەونوێژ لە هەموو نوێژە سوننەتە ڕەهاکان باشترە، نەوەك سوننەتە جەخت لێکراوەکان لای جمهوری زانایان، بە پێچەوانەی هەندێك لە شافعی مەزهەبەکانەوە[١٦].

ئیبن عوسەیمین دەڵێت: زانایان بە ڕەحمەتبن ناکۆکن ڕۆژووگرتنی مانگی موحەڕەم باشترە یان مانگی شەعبان، هەندێك لە زانایان دەڵێن: مانگی شەعبان باشترە، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ زۆربەی ڕۆژەکانی

---

١٦. بڕوانە: (لطائف المعارف)(١٢٨-١٢٩).

بە ڕۆژوو دەبوو، جێگیر نەبووە کە زۆربەی مانگی موحەڕەم بە ڕۆژوو بوو بێت، بەڵام هانی موسڵمانانی داوە لەو مانگە بە ڕۆژووبن بەو فەرموودەیەی: ((أَفْضَلُ الصِّيامِ بَعْدَ رَمَضانَ، شَهْرُ اللَّهِ المُحَرَّمُ))، دەڵێن: ڕۆژووی مانگی شەعبان وەك پلەوپایەی نوێژە سوننەتە جەختلێکراوەکانی پێش نوێژە فەرزەکانە، ڕۆژووی مانگی موحەڕەم پلەوپایەی وەك سوننەتی ڕەها وایە، پلەوپایەی سوننەتی جەختلێکراوە باشترە لە پلەوپایەی سوننەتی ڕەها، بە هەرحاڵ ئەم دوو مانگە سوننەتە ڕۆژوویان تێدا بگیرێت، بەڵام هەموو مانگی شەعبان بە ڕۆژوو نابێت[١٧].

١٧. (الشرح الممتع)(٦/٤٦٧.٤٦٨).

## ڕۆژی عاشورا

ڕۆژی عاشورا ڕۆژێکی زانراو و پیرۆز بووە لای قورەیش پێش هاتنی ئیسلام، ڕۆژوویان تێدا گرتووە، هەروەها سەلماوە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو ڕۆژە بە ڕۆژوو بووە، بوخاری و مسلم لە عائیشەی دایکی باوەڕدارانەوە رضي الله عنها ڕیوایەتیانکردووە دەڵێت: ((كَانَ عَاشُورَاءُ يَوْمًا تَصُومُهُ قُرَيْشٌ فِي الْجَاهِلِيَّةِ، وَكَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَصُومُهُ، فَلَمَّا قَدِمَ الْمَدِينَةَ صَامَهُ وَأَمَرَ بِصِيَامِهِ، فَلَمَّا نَزَلَ رَمَضَانُ كَانَ مَنْ شَاءَ صَامَهُ، وَمَنْ شَاءَ لَا يَصُومُهُ)).

واتە: عاشورا ڕۆژێك بوو قورەیش ڕۆژووی تێدا دەگرت لە سەردەمی نەفامی، پێغەمبەری خواش ﷺ ئەو ڕۆژە بە ڕۆژوو دەبوو، کاتێك کۆچی کرد بۆ مەدینە ئەو ڕۆژە ڕۆژووی دەگرت و فەرمانیکرد ئەو ڕۆژە بە ڕۆژووبن، کاتێك ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان فەرزکرا هەرکەس بیویستایە بە ڕۆژوو دەبوو، هەرکەس ویستی نەبووایە ڕۆژووی نەدەگرت.

بوخاری لە عائیشەی دایکی باوەڕدارانەوە ﵂ ڕیوایەتیکردووە دەڵێت: ((كَانُوا يَصُومُونَ عَاشُورَاءَ قَبْلَ أَنْ يُفْرَضَ رَمَضَانُ، وَكَانَ يَوْمًا تُسْتَرُ فِيهِ الْكَعْبَةُ)).

واتە: ڕۆژووی عاشورایان دەگرت پێش ئەوەی ڕۆژی ڕەمەزان فەرز بکرێت، لەو ڕۆژەدا کەعبە بەرگی بە بەردا دەکرا.

هەندێك لە زانایان دەڵێن: پێش ئەوەی ڕۆژووی ڕەمەزان فەرز بکرێت ڕۆژووی عاشورا فەرز بووە ، ئەم فەرموودەیە دەکەنە بەڵگە: بوخاری و مسلم لە سەلەمەی کوڕی ئەکوەعەوە ﵁ ڕیوایەتیانکردووە دەڵێت: ((أَمَرَ النَّبِيُّ ﷺ رَجُلًا مِنْ أَسْلَمَ، أَنْ أَذِّنْ فِي النَّاسِ: أَنَّ مَنْ كَانَ أَكَلَ فَلْيَصُمْ بَقِيَّةَ يَوْمِهِ، وَمَنْ لَمْ يَكُنْ أَكَلَ فَلْيَصُمْ، فَإِنَّ الْيَوْمَ يَوْمُ عَاشُورَاءَ)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بە پیاوێك لە هۆزی ئەسلەم کرد جاڕ بدات بە نێو خەڵکدا: هەرکەس شتی خواردووە ئەوەندەی ماوە لە

ڕۆژ بە ڕۆژوو بێت، هەرکەس شتی نەخواردووە بە ڕۆژوو بێت، چونکە ئەمڕۆ ڕۆژی عاشورایە.

ئەو فەرموودەیەی: بوخاری و مسلم لە عائیشەی دایکی باوەڕدارانەوە رضي الله عنها ڕیوایەتیانکردووە دەڵێت: ((كَانَ النَّبِيُّ صلى الله عليه وسلم يَصُومُهُ، فَلَمَّا قَدِمَ الْمَدِينَةَ صَامَهُ وَأَمَرَ بِصِيَامِهِ)).

هەروەها جوولەکەکان ڕۆژی عاشورایان بە گەورە دەزانی و ڕۆژوویان تێدا دەگرت، چونکە خوا سبحانه وتعالى لەو ڕۆژەدا پێغەمبەر موسا عليه السلام و نەوەکانی ئیسرائیلی لە فیرعەون و داروودەستەکەی ڕزگار کرد، کاتێك پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم کۆچیکرد بینی جوولەکەکان ڕۆژی عاشورا ڕۆژوویان دەگرت، بوخاری و مسلم لە ئیبن عەباسەوە رضي الله عنهما ڕیوایەتیانکردووە و ئەمە لەفزی بوخارییە، دەڵێت: ((قَدِمَ النَّبِيُّ صلى الله عليه وسلم الْمَدِينَةَ، فَرَأَى الْيَهُودَ تَصُومُ يَوْمَ عَاشُورَاءَ، فَقَالَ: مَا هَذَا، قَالُوا: هَذَا يَوْمٌ صَالِحٌ، هَذَا يَوْمٌ نَجَّى اللهُ بَنِي إِسْرَائِيلَ مِنْ عَدُوِّهِمْ، فَصَامَهُ مُوسَى، قَالَ: فَأَنَا أَحَقُّ بِمُوسَى مِنْكُمْ، فَصَامَهُ وَأَمَرَ بِصِيَامِهِ)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە مەدینە، بینی جوولەکەکان ڕۆژی عاشورا بە ڕۆژوو دەبن، فەرمووی: بۆچی بە ڕۆژوو دەبن ؟ گوتیان: ئەمە ڕۆژێکی پیرۆزە، خوا ﷻ نەوەکانی ئیسرائیلی ڕزگارکرد لە دوژمنەکەیان، بۆیە پێغەمبەر موسا ﵇ ڕۆژووی گرتووە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: من شایانترو لەپێشترم بۆ پێغەمبەر موسا ﵇ لە ئێوە، ڕۆژوویگرت و فەرمانیکرد ڕۆژوو بگرن.

بەڵام دوای فەرزبوونی مانگی ڕەمەزان، ڕۆژووگرتنی ڕۆژی عاشورا بووەتە سوننەت، مسلم لە عائیشەی دایکی باوەڕدارانەوە ﵂ ڕیوایەتیانکردووە دەڵێت: ((كانَ رَسولُ اللهِ ﷺ يَأْمُرُ بِصِيامِهِ قَبْلَ أنْ يُفْرَضَ رَمَضانُ، فَلَمّا فُرِضَ رَمَضانُ، كانَ مَن شاءَ صامَ يَومَ عاشُوراءَ ومَن شاءَ أفْطَرَ)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بە ڕۆژووگرتنی عاشورا دەکرد پێش ئەوەی ڕۆژووی ڕەمەزان فەرز بکرێت، کاتێك ڕەمەزان فەرزکرا،

کێ ویستی لەسەربوو ڕۆژووی عاشورای دەگرت، کێ ویستی لێنەبووایە ئەو ڕۆژە ڕۆژووی نەدەگرت.

بوخاری و مسلم لە حەمیدی کوڕی عبدالرحمانەوە ڕیوایەتیانکردووە: ((أنّهُ سَمِعَ مُعاوِيَةَ بنَ أبِي سُفْيانَ رضي الله عنهما، يَومَ عاشُوراءَ عامَ حَجَّ على المِنبَرِ يقولُ: يا أهْلَ المَدِينَةِ أيْنَ عُلَماؤُكُمْ؟ سَمِعْتُ رَسولَ اللَّهِ ﷺ، يقولُ: هذا يَوْمُ عاشُوراءَ ولَمْ يَكْتُبِ اللَّهُ علَيْكُم صِيامَهُ، وأَنا صائِمٌ، فمَن شاءَ فَلْيَصُمْ ومَن شاءَ فَلْيُفْطِرْ)).

واتە: لە موعاویەی کوڕی ئەبوسوفیانی رضي الله عنهما بیست، لە ڕۆژی عاشورا دوای حەج لەسەر مینبەر دەیگوت: ئەی خەڵکی مەدینە کوا زاناکانتان ؟ گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو ﷺ دەیفەرموو: ئەمە ڕۆژی عاشورایە خوا ڕۆژووگرتنی لەسەر فەرز نەکردوون، من ڕۆژوودەگرم، کێ دەیەوێت ڕۆژوو بگرێت، کێ دەیەوێت دەتوانێت ڕۆژوو نەگرێت.

جێگای ئاماژە پێکردنە هەندێك ناكۆكی هەیە لەسەر ئەوەی ئایا عاشورا ڕۆژی نۆیەمە یان دەیەم و بۆچوونێكی لاوازی هەیە ئاماژە بۆ ئەوە دەكات ڕۆژی یازدەیەمە، بەڵام دەقی ڕاشكاو لە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو پرسەی یەكلا كردووەتەوە، ترمزی لە ئیبن عەباسەوە رضي الله عنهما ڕیوایەتیكردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: ((أمرَ رسولُ اللهِ ﷺ بصومِ عاشوراءَ يومَ العاشرِ)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بە ڕۆژووگرتنی ڕۆژی عاشورا كرد، كە ڕۆژی دەیەمی مانگی موحەڕەمە.

بەزار لە ئەبوهورەیرە رضي الله عنه ڕیوایەتیكردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ: ((عَاشُوراءَ يَوْمُ الْعَاشِرِ)).

واتە: عاشورا ڕۆژی دەیەمە.

ترمزی دەڵێت: زانایان ناکۆکن دەربارەی ڕۆژی عاشورا، هەندێکیان دەڵێن: ڕۆژی نۆیەمە، هەندێکیان دەڵێن: ڕۆژی دەیەمە، لە ئیبن عەباسەوە ڕیوایەتکراوە دەڵێت: (صُومُوا التَّاسِعَ وَالعَاشِرَ وَخَالِفُوا اليَهُودَ)[18]، واتە: ڕۆژی نۆیەم و دەیەم بە ڕۆژووبن و پێچەوانەی جوولەکە بکەن؛ پاشان ئاماژە بۆ ئەو فەرموودەیەی ئیبن عەباس دەکات: ((أَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِصَوْمِ عَاشُورَاءَ يَوْمُ عَاشِرٍ))، دەڵێت: ئەمە بۆچوونی شافعی و ئەحمەد و ئیسحاقە[19].

---

١٨. صححه الألباني في (صحيح الترمذي) حديث رقم(٧٥٥).
١٩. (جامع الترمذي)(٣/١١٩).

## پاداشتی ڕۆژی عاشورا

بوخاری لە ئیبن عەباسەوە ﷺ ڕیوایەتیکردووە دەڵێت: ((مَا رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَتَحَرَّى صِيَامَ يَوْمٍ فَضَّلَهُ عَلَى غَيْرِهِ إِلَّا هَذَا الْيَوْمَ، يَوْمَ عَاشُورَاءَ، وَهَذَا الشَّهْرَ، يَعْنِي شَهْرَ رَمَضَانَ)).

واتە: نەمبینیوە پێغەمبەری خوا ﷺ لێکۆڵێبێتەوە و گەڕابێت بە دوای ڕۆژێکدا و فەزڵی دابێت بەسەر ڕۆژووی تردا جگە لەم ڕۆژە ڕۆژی عاشورا، و ئەم مانگە، واتە: مانگی ڕەمەزان.

مسلم لە ئەبوقەتادەی ئەنصارییەوە ﷺ ڕیوایەتیکردووە دەڵێت: ((أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ سُئِلَ عَنْ صَوْمِ يَوْمِ عَاشُورَاءَ؟ فَقَالَ: يُكَفِّرُ السَّنَةَ الْمَاضِيَةَ)).

واتە: پرسیاری ڕۆژووگرتنی ڕۆژی عاشورا لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرا ؟ فەرمووی: کەفارەتی تاوانی ساڵی ڕابردووە.

بەڵگە هاتووە منداڵانیش هانبدرێن ڕۆژی عاشورا بە ڕۆژووبن، بوخاری و مسلم لە ڕوبەیعی کچی موعەویزی کوڕی عەفراوە ڕیوایەتیانکردووە و ئەمە لەفزی مسلمە، دەڵێت: ((أَرْسَلَ رَسُولُ اللّٰهِ ﷺ غَدَاةَ عَاشُورَاءَ إِلَى قُرَى الأَنْصَارِ الَّتِي حَوْلَ الْمَدِينَةِ: مَنْ كَانَ أَصْبَحَ صَائِمًا فَلْيُتِمَّ صَوْمَهُ، وَمَنْ كَانَ أَصْبَحَ مُفْطِرًا فَلْيُتِمَّ بَقِيَّةَ يَوْمِهِ، فَكُنَّا بَعْدَ ذَلِكَ نَصُومُهُ، وَنُصَوِّمُ صِبْيَانَنَا الصِّغَارَ مِنْهُمْ، إِنْ شَاءَ اللّٰهُ، وَنَذْهَبُ إِلَى الْمَسْجِدِ، فَنَجْعَلُ لَهُمْ اللُّعْبَةَ مِن الْعِهْنِ، فَإِذَا بَكَى أَحَدُهُمْ عَلَى الطعَامِ، أَعْطَيْنَاهَا إِيَّاهُ عِنْدَ الْإِفْطَارِ)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ دەمەو بەیانی ڕۆژی عاشورا هەواڵی نارد بۆ گوندەکانی پشتیوانان کە لە دەورووبەری مەدینەبوون پێی ڕاگەیاندن: هەرکەسێك ڕۆژی کردووەتەوە بە ڕۆژووبووە ڕۆژووگرتنەکەی تەواو بکات، هەرکەسێکیش بە ڕۆژوو نەبووە لە ئێستەوە بە ڕۆژوو بێت، دوای ئەوە ئێمە ڕۆژی عاشورا ڕۆژوومان دەگرت، ڕۆژووشمان بە منداڵە بچووکەکانیشمان دەگرت، بە ویستی خوا، دەڕۆیشتین بۆ مزگەوت

یاریمان لە خوری بۆ دروست دەکردن، ئەگەر منداڵێکیان بگریایە، بەو یاریانە سەرقاڵمان دەکردن هەتاکو بەربانگ.

ئەو کەفارەتەی لە پاداشتی ڕۆژووی عاشورادا هاتووە ئایا هەموو تاوانە گەورە و بچووکەکانیش دەگرێتەوە ؟ ئیبن تەیمییە دەڵێت: کەفارەتی دەستنوێژ و نوێژ و ڕۆژووی ڕەمەزان و عەرەفە و عاشورا تەنها بۆ تاوانە بچووکەکانە، هەروەها حەجیش[٢٠].

نەوەوی دەڵێت: لەوانەیە بگوترێت: ئەگەر دەستنوێژ کەفارەت بێت، نوێژ دەبێتە کەفارەتی چییە، هەروەها جومعەکان و ڕەمەزان و ڕۆژووی عەرەفە کە کەفارەتی دوو ساڵە و ڕۆژووی عاشورا کە کەفارەتی ساڵێکە، ئەگەر ئامینکردنەکەی هاوتای ئامینی فریشتە بێت دەبێتە کەفارەتی تاوانی پێشووی، زانایان بەوشێوەیە وەڵامیانداوەتەوە: هەریەکە لەو کردەوانەی باسکرا ئەگەر تاوانی بچووك هەبوو دەبنە

٢٠. (الفتاوى الكبرى)(٥/٣٤٤).

کەفارەتی، ئەگەر تاوانی بچووك و گەورەی نەبوو، لە پاداشتیدا چاکەی بۆ دەنوسرێت و پلەی پێ بەرزدەبێتەوە، ئەگەر خاوەنەکەی تاوانی گەورەی هەبوو یان کۆمەڵە تاوانی گەورەی هەبوو و تاوانی بچووکی نەبوو، ئومێدەوارین تاوانە گەورەکان سووك بکاتەوە[٢١].

٢١. (المنهاج شرح صحيح مسلم بن الحجاج)(١١٣/٣).

## ڕۆژووگرتنی ڕۆژی نۆیەم (تاسوعا) لەگەڵ ڕۆژی دەیەم

مسلم لە ئیبن عەباسەوە رضي الله عنهما ریوایەتیکردووە دەڵێت: ((حِينَ صَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَوْمَ عَاشُورَاءَ وَأَمَرَ بِصِيَامِهِ، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ! إِنَّهُ يَوْمٌ تُعَظِّمُهُ الْيَهُودُ وَالنَّصَارَى، فَقَالَ رسول الله ﷺ: فإذا كَانَ الْعَامُ الْمُقْبِلُ إِنْ شَاءَ اللَّهُ، صُمْنَا الْيَوْمَ التَّاسِعَ، قَالَ: فَلَمْ يَأْتِ الْعَامُ الْمُقْبِلُ، حَتَّى تُوُفِّيَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ)).

واتە: کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژووی عاشورای گرت و فەرمانی بە ڕۆژووگرتنی کرد، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئەو ڕۆژە جوولەکە و گاور بە گەورەی دەزانن، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ساڵی ئایندە إن شاء الله ڕۆژی نۆیەمیش بە ڕۆژوو دەبین، ساڵی ئایندە پێش ئەوەی ڕۆژی عاشورا بێتەوە پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتیکرد.

ئیبن تەیمییە دەڵێت: ڕۆژووگرتنی ڕۆژی عاشورا کەفارەتی تاوانی ساڵێکە، بە تەنها گرتنی مەکروه نییە، ئەوەی لە قسەی ئەحمەددا هاتووە

مەکروهە ئەوە بۆچوونی ئیبن عەباسە و ئەبوحەنیفەیە، ڕۆژووگرتنی عاشورا واجب بوو پاشان ئەو حوکمە نەسخکرایەوە، ئەوە بۆچوونی ئیبن عەباسە ﵄ و ڕیوایەتێکە لە ئەحمەدەوە و هەندێك لە هاوەڵەکانمان هەڵیانبژاردووە[٢٢].

ئەلبانی دەڵێت: ڕۆژووگرتنی عاشورا سوننەتە و دوو پلەیە: پلەی یەکەم باشترە کە ڕۆژووگرتنی ڕۆژی تاسوعا و عاشورایە پێکەوە، پلەی دووەم ڕۆژووگرتنی تەنها ڕۆژی عاشورایە[٢٣].

نەوەوی دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژی عاشورا ڕۆژووی دەگرت، باسی ئەوەیانکرد جوولەکە و گاور ئەو ڕۆژە ڕۆژوویان دەگرت، فەرمووی: ئەمە ڕاشکاوە ئەو ڕۆژە ڕۆژووی دەگرت ڕۆژی نۆیەم نەبوو، کەواتە عاشورا ڕۆژی دەیەمە، شافعی و هاوەڵانی و ئەحمەد و ئیسحاق و زانایانی تر دەڵێن: سوننەتە ڕۆژووی نۆ و دە ڕۆژوو

---

٢٢. (الفتاوی الکبری)(٣٧٨/٥).
٢٣. (الهدی والنور)(٣٣٧).

بگیرێت پێکەوە، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژی دەیەم ڕۆژوویگرتووە، نییەتی هەبووە ڕۆژی نۆیەم بە ڕۆژوو بێت[٢٤].

دیسان دەڵێت: زانایان لە هاوەڵەکانمان و جگە لەوانیش باسی حیکمەتی ڕۆژووگرتنی ڕۆژی نۆیەمیان کردووە لە چەند ڕوویەکەوە، دەڵێن: یەکەمیان: مەبەست پێچەوانەکردنی جوولەکەیە کە تەنها ڕۆژی دەیەم ڕۆژوویان دەگرت...، دووەم: مەبەست ڕۆژووگرتنی ڕۆژێکە پێش عاشورا بۆ ئەوەی بە تەنها نەبێت، وەك چۆن نەهیکراوە لە ڕۆژووگرتنی جومعە بە تەنها، ئەو دوو مەبەستە خەتابی و جگە لە ئەو باسیانکردووە، سێیەم: پاراستنی ڕۆژووی ڕۆژی دەیەم لە ترسی ئەوەی نەوەك سەرەتا مانگ نەبینرابێت و بکەوێتە هەڵەوە، بەوەش بە ژمارە ڕۆژی نۆیەم بێت لە هەمان کات و واقعدا ڕۆژی دەیەم بێت[٢٥].

---

٢٤. (المنهاج شرح صحيح مسلم بن الحجاج)(١٢/٨).
٢٥. (المجموع شرح المهذب)(٣٨٣/٦).

ئیبن تەیمییە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهیکردووە لە خۆچواندن بە خاوەن کتێبەکان لە زۆر فەرموودەدا وەك ئەو فەرموودەیە: ((إِنَّ الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى لَا يَصْبُغُونَ فَخَالِفُوهُمْ)) و ئەو فەرموودەیە: ((إِنَّ الْيَهُودَ لَا يُصَلُّونَ فِي نِعَالِهِمْ فَخَالِفُوهُمْ))، ئەو فەرموودەیەی سەبارەت بە عاشورا دەفەرموێت: ((لَئِنْ عِشْتُ إِلَى قَابِلٍ لَأَصُومَنَّ التَّاسِعَ))[٢٦].

ئیبن حەجەر دەڵێت: ئەوەی نییەتی هەبووە ڕۆژی نۆیەم بە ڕۆژوو بێت لەوانەیە بۆ ئەوە بێت بە تەنها ڕۆژی دەیەم نەگرێت و پارێزکاری لەو ڕۆژە بکات، یان بۆ پێچەوانەکردنی جوولەکە و گاور بووە و ئەمە ئەرجەحە، ئەمەش لە ئاماژەی ڕیوایەتەکانی مسلم و ئەحمەد لە ڕوویەکەوە لە ئیبن عەباسەوە رضي الله عنهما هاتووە: ((صُومُوا يَوْمَ عَاشُورَاءَ وَخَالِفُوا الْيَهُودَ صُومُوا يَوْمًا قَبْلَهُ أَوْ يَوْمًا بَعْدَهُ[٢٧]))[٢٨].

---

٢٦. (الفتاوى الكبرى)(١٧٥/٦).
٢٧. قال الألباني: إسناده ضعيف لسوء حفظ ابن أبي ليلى وخالفه عطاء وغيره فرواه عن ابن عباس موقوفا وسنده صحيح عند الطحاوي والبيهقي. (صحيح ابن خزيمة)(٢٩٠/٣).
٢٨. (فتح الباري)(٢٤٥/٤).

## ماتەم یان ئاهەنگێڕان لە ڕۆژی عاشورا

هیچ بەڵگەیەکی صەحیح نەهاتووە بەڵگەبێت لەسەر شەرعییەتی ئاهەنگێڕان و خۆڕازاندنەوە لە ڕۆژی عاشوراداا، بەڵکو جوولەکە جەژنیانگێڕاوە لەو ڕۆژەدا و پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کردووە پێچەوانەیان بکرێت موسڵمانان لەو ڕۆژەدا بە ڕۆژووبن، بوخاری و مسلم لە ئەبوموساوە رضي الله عنه ڕیوایەتیانکردووە دەڵێت: ((كَانَ يَوْمُ عَاشُورَاءَ تَعُدُّهُ الْيَهُودُ عِيدًا، قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: فَصُومُوهُ أَنْتُمْ)).

واتە: ڕۆژی عاشورا جوولەکە بە جەژنیان دەزانی، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئێوە لەو ڕۆژەدا بە ڕۆژووبن.

ئەسیوبی لە لێکدانەوەی ئەم فەرموودەیەدا دەڵێت: ئەوەی ئەو ڕۆژەیان بە گەورە دەزانی و باوەڕیان وابوو جەژنە لازم نییە ڕۆژوویان تێدا نەگرتبێت، لەوانەیە یەکێك لە کۆی ئەو شتانەی کە بە گەورەیان دەزانی ڕۆژووگرتنی بێت، ئەوە بە ڕاشکاوی لەو فەرموودەی بوخاری

کە لە ئەبوموساوە ﷺ ڕیوایەتیکردووە هاتووە: ((وإذا أناس من اليهود يعظمون عاشوراء، ويصومونه))، واتە: کەسانێك لە جوولەکە عاشورایان بە گەورە دەزانی و ڕۆژوویان تێدا دەگرت؛ و مسلم دوای ئەمە ڕیوایەتیکردووە: ((كان أهل خيبر يصومون يوم عاشوراء، يتخذونه عيدًا، ويلبسون نساءهم فيه حليّهم وشارتهم)).

واتە: جوولەکەکانی خەیبەر ڕۆژی عاشورا ڕۆژوویان دەگرت و دەیانکرد بە جەژن، لەو ڕۆژەدا ئافرەتەکانیان خشڵ و پۆشاکی جوانیان لەبەر دەکرد[٢٩].

ئیبن ڕەجەب دەڵێت: هەموو ئەوەی ڕیوایەتکراوە سەبارەت بە فەزڵی چاوڕەشتن و خۆشۆردن و خەنەکردن لە ڕۆژی عاشورادا هەڵبەستراوە و صەحیح نییە[٣٠].

٢٩. (البحر المحيط الثجاج في شرح صحيح الإمام مسلم بن الحجاج)(٢١٢/٢١).
٣٠. (لطائف المعارف)(١٠٢).

ئیبن تەیمییە دەڵێت: دروست نییە بۆ هیچ کەس شتێك لە شەریعەت بگۆڕێت لەبەر هیچ کەس، دەربڕینی خۆشی و شادی لە ڕۆژی عاشورادا و بەخشینی زیاتر لەو ڕۆژەدا لە بیدعە داهێنراوەکانە[٣١].

ئیبن عوسەیمین دەڵێت: دەربڕینی خۆشحاڵی لە شەوی بیست وحەوتی ڕەجەب و شەوی بەرات یان لە ڕۆژی عاشورا، هیچ بنەمایەکی نییە و نەهی لێدەکرێت، مرۆڤ ئەگەر بانگکرا بۆ ئەو بۆنەیە نابێت ئامادەی بێت، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((إيّاكُم ومُحْدثاتِ الأمورِ ، فإنَّ كلَّ بدعةٍ ضلالةٌ)).

واتە: وریای شتە تازە داهێنراوەکان بن، چونکە هەموو داهێنراوێك لە ئایندا بیدعەیە[٣٢].

---

٣١. (اقتضاء الصراط المستقيم لمخالفة أصحاب الجحيم )(١٣٣/٢).
٣٢. (مجموع فتاوى ورسائل)(١٩٣/١٦).

ئیبن قەیم دەڵێت: ئەو فەرموودانەی باسی چاوڕەشتن و پرچ چەورکردن و بۆنی خۆش بەکارهێنان دەکات لە ڕۆژی عاشورادا درۆزنەکان دایانهێناوە، لە بەرامبەر ئەواندا کەسانێك ڕۆژی عاشورایان کردووە بە ڕۆژی دڵتەنگی و ماتەمگێڕان، هەردوو کۆمەڵەکە موبتەدیعن و لە سوننەت دەرچوون، ئەهلی سوننەت ئەو کردەوەیە جێبەجێ دەکەن کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردوون کە ڕۆژووگرتنە و دووردەکەونەوە لەوەی شەیتان فەرمانی پێدەکات لە بیدعە داهێنراوەکان[٣٣].

---

٣٣. (المنار المنيف في الصحيح والضعيف)(١٠٤).

## چەند وانە و پەندێك لە مانگی موحەڕەم و ڕۆژی عاشورا

١. بە هاتنی مانگی موحەڕەم مرۆڤ ساڵێك لە تەمەنی زێڕینی بەسەر دەچێت، پێویستە بیر بکاتەوە چی کردەوەیەکی لە ساڵی ڕابردوودا ئەنجامداوە ئەگەر کردەوەکانی باشبوون سوپاسی خوایان لەسەر بکات و هەوڵبدات کردەوەی زیاتر ئەنجامبدات، ئەگەر کردەوەی خراپی لەو ساڵەدا ئەنجام دابێت پێویستە تەوبە بکات و پەشیمان ببێتەوە، چونکە دڵنیا نییە دەگاتەوە ساڵێکی نوێ.

٢. مانگی موحەڕەم یەکێکە لە مانگە حەرامەکان کە خوا ﷻ دەربارەیان فەرموویەتی: ﴿فَلَا تَظۡلِمُواْ فِيهِنَّ أَنفُسَكُمۡۚ﴾، خراپە و تاوانکاری و ستەم لە نەفس لە هەموو مانگەکاندا خراپە لە مانگە حەرامەکاندا خراپترە وەك ئیبن کەسیر لە تەفسیرەکەیدا باسیکردووە.

٣. مانگی موحەڕەم کراوەتە سەری ساڵی کۆچی چونکە کۆچ وەك پێشەوا عومەر دەڵێت: جیاوازیکرد لە نێوان حەق و باتڵدا.

٤. ڕۆژی عاشورا ئەو ڕۆژەیە کە فیرعەون و داروودەستەکەی لە دەریای سووردا خنکان، ستەم چەند درێژە بکێشێت کۆتایی دێت فیرعەون دەیگوت: من پەروەردگارتانم! خوا ﷻ مۆڵەتیدا هەتاکو زیاتر لە ملهوڕی و سەرکەشیدا ڕۆچوو، خوا ﷻ دەفەرموێت:

﴿وَجَٰوَزْنَا بِبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱلْبَحْرَ فَأَتْبَعَهُمْ فِرْعَوْنُ وَجُنُودُهُۥ بَغْيًا وَعَدْوًا ۖ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَدْرَكَهُ ٱلْغَرَقُ قَالَ ءَامَنتُ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱلَّذِىٓ ءَامَنَتْ بِهِۦ بَنُوٓا۟ إِسْرَٰٓءِيلَ وَأَنَا۠ مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿٩٠﴾ ءَآلْـَٔـٰنَ وَقَدْ عَصَيْتَ قَبْلُ وَكُنتَ مِنَ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٩١﴾﴾(يُونُس).

واتە: نەوەکانی ئیسرائیلمان لە دەریاکە پەڕاندەوە، فیرعەون و سەربازەکانی لەبەر ستەمکاری و دوژمنایەتیان شوێنیانکەوتن، هەتاکو خەریك بوو بخنکێت گوتی: بە دڵنیاییەوە باوەڕم هێنا کە هیچ پەرستراوێکی حەق نییە جگە لەو پەرستراوەی نەوەکانی ئیسرائیل باوەڕیان پێهێناوە، منیش لە موسڵمانانم! ئێستا باوەڕ دەهێنیت؟ پێشتر یاخی بوویت و سەرپێچیت دەکرد، لە ڕیزی تێکدەر و خراپەکاران بوویت.

ئەحمەد و ترمزی لە ئیبن عەباسەوە رضي الله عنهما ڕیوایەتیانکردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: کاتێك خوا ﷻ فیرعەونی خنکاند، فیرعەون گوتی: ﴿ءَامَنتُ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱلَّذِيٓ ءَامَنَتۡ بِهِۦ بَنُوٓاْ إِسۡرَٰٓءِيلَ﴾، جبریل عليه السلام فەرمووی: ئەی محمد ئەگەر منت ببینایە چۆن لە قوڕی دەریام دەکرد بە قوڕگیا لە ترسی ئەوەی نەوەك ڕەحمەتی خوا ﷻ بیگرێتەوە.

٥. ڕۆژی عاشورا وانەی ئەوەی تێدایە بە خۆشی موسڵمان دڵخۆشبین، بە ئازار و دەردیسەرییان دڵتەنگبین، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك پێیان ڕاگەیاند جوولەکەکان ڕۆژی عاشورا بە ڕۆژوودەبن، فەرمووی: ئێمە لە پێشترین بۆ پێغەمبەر موسا عليه السلام، ڕۆژوویگرت و فەرمانی بە موسڵمانانیش کرد ئەو ڕۆژە بە ڕۆژووبن.

٦. لە ڕۆژووی عاشورادا حوسەینی کوڕی عەلی رضي الله عنهما شەهیدکراوە کە یەکێکە لە پێشەواکانی گەنجانی بەهەشت، ئەو ئازارەی هەتا ئێستاش

بەسوێیە، ئەمەش شومی ناکۆکی و دووبەرەکی لە ئیسلامدا دەردەخات.

٧. کاتێك بێباوەڕانی قورەیش هەموو دەرگاکانی گفتوگۆیان داخست و گوێیان بۆ بەڵگە و نیشانەکان نەگرت و باوەڕیان نەهێنا، خوا ﷻ دەرووی لە پێغەمبەری خوا ﷺ و موسڵمانان کردەوە و شاری مەدینەی کردە ئەو جێگایەی بتوانن ئایینداری تێدا بکەن و بتوانن لەوێوە ئیسلام بە هەموو جیهان ڕابگەیەنن.

## سەرچاوەکان

١. (الفوائد)، محمد بن أبي بكر بن أيوب بن سعد شمس الدين ابن قيم الجوزية (ت ٧٥١هـ) الناشر: دار الكتب العلمية – بيروت ،الطبعة: الثانية، ١٣٩٣هـ - ١٩٧٣م.

٢. (زهر الربى على المجتبى)، عبد الرحمن بن أبي بكر، جلال الدين السيوطي (ت ٩١١هـ)، الناشر: مكتب المطبوعات الإسلامية – حلب، الطبعة: الثانية، ١٤٠٦هـ- ١٩٨٦م.

٣. (الديباج على صحيح مسلم بن الحجاج)، أبو زكريا محيي الدين يحيى بن شرف النووي (ت ٦٧٦هـ)، الناشر: دار إحياء التراث العربي – بيروت، الطبعة: الثانية، ١٣٩٢هـ.

٤. (عمدة الكتاب)، أبو جعفر النَّحَّاس أحمد بن محمد بن إسماعيل بن يونس المرادي النحوي (ت ٣٣٨هـ)، الناشر: دار ابن حزم-الجفان والجابي للطباعة والنشر الطبعة: الأولى ١٤٢٥هـ - ٢٠٠٤م.

٥. (الكامل في التاريخ)، أبو الحسن علي بن أبي الكرم محمد بن محمد بن عبد الكريم بن عبد الواحد الشيباني الجزري، عز الدين ابن الأثير (ت ٦٣٠هـ)، الناشر: دار الكتاب العربي، بيروت – لبنان، الطبعة: الأولى، ١٤١٧هـ - ١٩٩٧م.

٦. (فتح الباري) أحمد بن علي بن حجر العسقلاني (٧٧٣- ٨٥٢هـ)، الناشر: دار المعرفة - بيروت، ١٣٧٩هـ.

٧. (سلسلة الأحاديث الضعيفة والموضوعة وأثرها السيئ في الأمة)، أبو عبد الرحمن محمد ناصر الدين بن الحاج نوح بن نجاتي بن آدم الأشقودري الألباني (ت ١٤٢٠هـ)، دار النشر: دار المعارف، الرياض - المملكة العربية السعودية، الطبعة: الأولى، ١٤١٢هـ - ١٩٩٢م.

٨. (لطائف المعارف فيما لمواسم العام من الوظائف)، زين الدين أبو الفرج عبد الرحمن بن شهاب الدين أحمد بن رجب الحنبلي البغدادي الدمشقي (٦٣٦-٧٩٥هـ)، الناشر: المكتب الإسلامي، بيروت، الطبعة: الأولى، ١٤٢٨هـ - ٢٠٠٧م.

٩. (الشرح الممتع على زاد المستقنع)، محمد بن صالح العثيمين دار النشر: دار ابن الجوزي، الطبعة: الأولى، ١٤٢٢ - ١٤٢٨هـ.

١٠. (سنن الترمذي)، محمد بن عيسى بن سَوْرة بن موسى بن الضحاك، الترمذي، أبو عيسى (ت ٢٧٩هـ)، الناشر: شركة مكتبة ومطبعة مصطفى البابي الحلبي – مصر، الطبعة: الثانية، ١٣٩٥هـ - ١٩٧٥م.

١١. (الفتاوى الكبرى)، تقي الدين أبو العباس أحمد بن عبد الحليم بن عبد السلام بن عبد الله بن أبي القاسم بن محمد ابن تيمية الحراني الحنبلي الدمشقي (ت ٧٢٨هـ)، الناشر: دار الكتب العلمية الطبعة: الأولى، ١٤٠٨هـ - ١٩٨٧م.

١٢. (المنهاج شرح صحيح مسلم بن الحجاج)، أبو زكريا محيي الدين يحيى بن شرف النووي (ت ٦٧٦هـ)، الناشر: دار إحياء التراث العربي – بيروت، الطبعة: الثانية، ١٣٩٢هـ.

١٢. (المجموع شرح المهذب)، أبو زكريا محيي الدين بن شرف النووي (ت ٦٧٦ هـ)، الناشر: (إدارة الطباعة المنيرية، مطبعة التضامن الأخوي) – القاهرة، عام النشر:١٣٤٤ - ١٣٤٧هـ.

١٣. (صحيح ابن خزيمة)، إمام الأئمة أبو بكر محمد بن إسحاق بن خزيمة السلمي النيسابوري (ت ٣١١ هـ).

١٤. (اقتضاء الصراط المستقيم لمخالفة أصحاب الجحيم )، تقي الدين أبو العباس أحمد بن عبد الحليم بن عبد السلام بن عبد الله بن أبي القاسم بن محمد ابن تيمية الحراني الحنبلي الدمشقي (ت ٧٢٨هـ)، الناشر: دار عالم الكتب، بيروت، لبنان، الطبعة: السابعة، ١٤١٩هـ - ١٩٩٩م.

١٥. (مجموع فتاوى ورسائل)، محمد بن صالح بن محمد العثيمين (المتوفى: ١٤٢١هـ)، الناشر: دار الوطن - دار الثراء، الطبعة: الأخيرة - ١٤١٣هـ.

١٦. (المنار المنيف في الصحيح والضعيف) أبو عبد الله محمد بن أبي بكر بن أيوب ابن قيم الجوزية (٦٩١ – ٧٥١)، الناشر: دار عطاءات العلم (الرياض) - دار ابن حزم (بيروت)الطبعة: الرابعة، ١٤٤٠ هـ - ٢٠١٩ م (الأولى لدار ابن حزم).

١٧. (الإصابة في تمييز الصحابة)، أبو الفضل أحمد بن علي بن محمد بن أحمد بن حجر العسقلاني (ت ٨٥٢هـ)، الناشر: دار الكتب العلمية – بيروت الطبعة: الأولى - ١٤١٥هـ .

١٨. (البحر المحيط الثجاج في شرح صحيح الإمام مسلم بن الحجاج)، محمد بن علي بن آدم بن موسى الإتيوبي الولوي، الناشر: دار ابن الجوزي-الرياض الطبعة: الأولى، (١٤٢٦ - ١٤٣٦ هـ).

١٩. (لقاء الباب المفتوح)، محمد بن صالح بن محمد العثيمين.

٢٠. (الإجابات المهمة في المشاكل المدلهمة)، صالح بن فوزان الفوزان، الطبعة الأولى ١٤٢٥هـ.

٢١. (فتاوى اللجنة الدائمة - المجموعة الثانية)، اللجنة الدائمة للبحوث العلمية والإفتاء، الناشر: رئاسة إدارة البحوث العلمية والإفتاء-الإدارة العامة للطبع-الرياض.

# ناوەڕۆك

